# شیکاری بۆ هەندێك
# یاری و گۆرانی فۆلکلۆری منداڵان

ئازاد ساڵح (شنرویّ)

٢٠٢٢

## شیکاری بۆ هەندێك یاری و گۆرانی فۆلكلۆری منالان

- نووسینی: ئازاد ساڵح
- بابەت: موزیک
- نووسینی نۆتەکان: ئازاد ساڵح
- پیێداچوونەوەی: مەریوان سەلاح حیلمی
- تایپ: بیار رەشید
- کێشانی وێنەکانی ناوەوە: جوان ساڵح
- دیزاینی بەرگ و ناوەرۆک: نزار نوری
- چاپخانە: ئاکام
- تیراژ: ١٥٠ دانە
- نرخ: (٢٠٠٠) دینار
- نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم
- ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی (١٩٢٦)ی ساڵی (٢٠٢٢)ی پێدراوە

**بە سوپاسەوە، لەسەر ئەرکی بەڕێز (ئازاد تۆفیق) پارێزگاری هەڵەبجە چاپکراوە**

# پێشەکی

هەرکاتێك کتێبێکی هونەری دەخوێنمەوە بەتایبەتی بەرهەمی نوسەرو هونەرمەندێکی کورد بێت، خەیاڵ ئەمباتەوە بۆرۆژانی خوێندکاریم لەپەیمانگای هونەرەجوانەکانی شاری موسڵ لەناوەڕاستی ساڵانی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو، مـن وکۆمـەڵێك هـاوڕێم لـەو پەیمانگایـە دەمانخوێنـد کۆمـەڵێکیان تـاکو ئێستاهونەرمەندی دیارو بەردەوامن لەخزمەتکردنی هونەری کوردی.

دیارە لەو سەردەمەدا چەندکتێبێکی هونەری موزیکی کوردی لەکتێبخانەی کوردیدا بەردەست بوو، یان ئەگەر چاوپێکەوتنێك یا شـیکاری بابـەتێکی هونەری لەگەڵ هونەرمەندان (ئەنوەر قەرداخی و وریا ئەحمەد و ئەنوەر ساڵح) هونەرمەندانی دیکە لەگۆڤارەکانی(بەیان - ڕۆشـنبیری نـوێ - کـاروان) بـلاو بوایەتەوەو بەرچاومان بکەوتایە چەندین جار ئەمانخوێندەو تاوتوێمان دەکرد.چەند دانەیەك لەوکتێبانەی لەو سەردەمەدا چـاپ کرابـوون لای بەنـدە هـەبوو (دەروازەیەك بۆئاوازو مۆسیقای کوردی) مەحمود زامدار و (گەنجینەی مۆسیقای کـوردی) عوسمـان شـارباژێڕی و( کتـێبی ئامێرەکـانی مۆسـیقای کـوردی ) مامۆستا وریائەحمەد. کتێب لەبارەی موزیکی گۆرانی منداڵانیش لەوسەردەمەو سـالانی نەوەتـەکانیش هەریـەك دووسـێ کتێبیـك ئامـادەکرابوو کـەرۆڵی بەرچاویان هەبوو وەکو نموونە کتێبێکی قەوارە بچووکی مامۆستای خوالێخۆش بوو (سەباح محەمەد ئەمین) بەناوی (ئەڤین) کۆمەڵێك نۆتەی گۆرانی منالانی لەخۆگرتبوو نموونەی (باخەکەمان ڕازاوە - لاچۆ لاچۆ دەی بڕۆ) لەبیرەوەری ئێمەی هونەرمەندان و منالانی هەشتاکان ونەوەدەکانی سەدەی ڕابردوودا بەجێ هێشتووە.

چەندکتێبێکیش بۆهونەرمەندان حەسەن زیرەك بەناوی (چریکەی کوردستان) و (گۆرانێکانم) تایبەت بەشیعرو گۆرانێکانی مامۆستا عەلی مـەردان، کتێبەکەی چریکەی کوردستان نۆتەی هەندی لەگۆرانییەکانی تیا بوو کەدەمانژەن زۆر پێی دڵخۆش دەبووین. هەروەها نابێت ڕۆڵی کتێبـەکانی (فێربـوونی کەمانچەی) و (تیۆری مۆسیقا) هونەرمەند مامۆستا (سەلاح ڕەئووف) لەیاد بکەین کەرۆڵێکی بەرچاوی هەبوو بۆموزیـسیانانی کـورد جگـە لـەڕاهێنان و ڕێنمایکردنی فێرخوازانی کەمانچە، کۆمەڵێك پارچە موزیکی هونەرمەندانی دیـاری کـوردی لـەخۆ گرتبـوو، لەلایـەکی تـرەوە زۆربـەی هێمـاو زاراوەکـانی وەرگێرابووە سەرزمانی شیرینی کوردی کەئێمەو کۆمەڵێك لە هاوڕێکانمان لەسەرەتای ساڵانی هەشتاکاندا لای هونەرمەنـد ( قـادر مـەردان) لەسـەر کتـێبی (فێربـوونی کەمانـچە) سـەرەتاکانی ئـامێری کەمانـچەمان خوێنـد. بەگـشتی سـوودمان لەهـەموو ئەوکتێبـە هونەرییانـە بـینی و پێـی دڵخـۆش دەبـووین کەهەموویان بەزمانی شیرینی کوردی لەسەردەمی زوڵم زۆری حکومەتی بەعسدا نوسرابوون بەتایبەتی کەئێمە لەشاری کەرکودا دەژیـاین پرۆسـەی خوێنـدن

بەزمانی عەرەبی بوو. بەڕاستی کتێب و کتێبخانەکان ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبوو لەبەرز ڕاگرتن و بەرەو پێشچوونی کلتوروئەدەب و هونەرو کوردی.

لێرەوەدەستخۆشی لەهاوڕێ و هونەرمەند ئازاد سالح بکەم بۆچاپکردنی ئەم کتێبەی لەمەڕ گـۆرانی و یـاری منـدالاًن. هەڵبەتـە ئـەو یاریانـە گـۆرانی ئامێزن هەریەکەیان ئاوازێکی تایبەتی خۆی هەیە، هەندێکیان شـێوەی ریـستاتیڤی[١] هەیـە واتـە لەسـەر یـەك دەنـگ دەمێنێتـەوە (ئۆنـسیۆن[٢]) یـان لـە میانەیەکی سیانی گەورەدا[٣] یان میانەیەکی دوانی گـەورە[٤] دەیـچڕن، ڕەنگـە هەنـدێ میانـەی تـریش هـەبێت بـەلاّم دەگمـەنن. ئـەم یـاری و گۆرانییانـە لەبیرەوەری ئێمەوهاوتەمەنەکانمان و نەوەی پێش ئێمەو دوای ئێمەش هەن، ڕەنگە زۆربەمان گۆرانی (هۆڕێوی ڕێوی)مان لـەیاد بێـت یـان لەگـەڵ منـالاًنی هاوتەمەنی خۆمان بەکۆمەڵ ووتبێتمانەوە یان بەشداری (بووکە بەبارانێ)مان کردبێت، لەقۆناغی سەرەتایی (حاجی لەق لـەق مـار هـات) مـان خوێنـدبێت کەهەندێکیان لەشێوەی ئۆپەرێتێکی مندالاًندا دەردەکەون شێوەیەك لەنواندن و لەهەمانکاتدا گۆرانی و ئاوازی تێدەکەوێت. هەڵبەتـە کۆکردنـەوەی هـەموو ئەم چـمکە هونـەری و کلتوریانـە خزمـەتێکی بەرچـاو بەهونـەری کـوردی دەگەیـەنێت لـەڕووی ئەرشـیف کـردن تۆمـارکردن و پاراسـتنیان و ڕزگارکردنیـان لەفەوتاندن. هەروەها ناساندنی بەنەوەی نوێ چونکە لەگەڵ پێشکەوتنی زانست گۆڕانی ژیانی کۆمەلاّیەتی نەك لای ئێمەی کورد بـەلکو لەتـەواوی دونیـادا ئەم یارییانە بەهۆی ئای پادو مۆبایل و یاری ئەلیکترۆنیەوە فەرامۆش کراوە، مندالاًن کەوتوونەتە ناو دنیای خۆیانەوە بۆیـە لەسـەرهونەرمەندان و نوسـەران پێویستە هەرکەسەو لەناوچەو زێدی خۆیەوە بەتایبەتی شارەزایان قۆڵی لیّ هەڵماڵن کەلتورو دابونەریتمان بپارێزن.

لەیادەوەری مندالّی من و ڕەنگە هاوشارێکانیشمان چەندین گۆرانی و یاری مندالاًن هەبێت نموونـەی گـۆرانی ( کوکـوختی ) لەشـاری کـەرکوك پێـی دەڵێن (بیبی سوو) ڕیتمی ئەم گۆرانیە ٨|٥ لەڕیتم و کێشە لەنگەکانە دیارە گۆرانیەکە لە خوێندنی باڵندەکەوە وەرگیراوە هەڵبەستەکەی بەم چەشنەیە:

١. بیبی سو کوکو کو ئاو بێنە بۆ من و تو

---

[١] (Recitive) ریستاتیف واتە قسەکردن و ووتووێژی ئاوازدار کەلەناو ئۆپێرِاکاندا پەیڕەو دەکرا، بەعەرەبی (الالقاء المنغم).

[٢] (unison) واتە لەسەر هەمان چینە دەنگە ئاوازەکە لەسەر یەك دەنگ دەمێنێتەوە ناگۆڕێت بۆدەنگی تر تاکو کۆتایی.

[٣] (Major third) میانەی سیانی گەورە نموونەی میانەی نێوان پلەدەنگی دۆ بۆ می.

[٤] (Major second) میانەی دوانی گەورە نموونەی میانەی نێوان پلەدەنگی دۆ بۆ ڕێ .



سو - بی - بی                کو - کو - کو              ئاو - بێ - نە - بۆ              تو - نو - م

شێوەیەکی تر لە هەڵبەستی ئەم گۆرانییە هەیە، زمانی تورکمانی تێدەکەوێت هەرهەمان ئاوازە بەشێوەیە

بیبی سو       سو گیاتە               ئاو بێنە بۆمنو تو

لای منالآنی شاری موسلیش هەمان ریتم بۆ گۆرانی کوکوختی هەیە.

٢- ئایشە  بنەوشە  گسکێ بدە لەو حەوشە                هەتا دایکت دێتەوە شیر مانگاکە بدۆشە



ئا - ی-شە    بنەی_ شە    گس-کێ ب-دە    لەو-حەو-شە    هە-تا  دای-کت   دێ - تە-وە    شیر-مان-گا-کە    ب - دۆشە

هەڵبەتە ئەگەر کنەو پشکنین بەراورکاری بکەین گەلێك یاری وگۆرانی لەناوچەجیاوازەکانی تری کوردستان  هەیە هاوبەشیش لەگەلێك لەم گۆرانیانەدا هەیە ئەگەر جیاوازیەکی بچووك لەپەیڤەکانیدا هەبێت یان وەکو یەکن کەزۆرێك لەوانە کاك ئازاد سالّح ئاماژەی پێ کردووەو لەم کتێبەدا بەجوانی و زانستیانە ئامادەی کردووە.

تەوەرێکی تر حەزم کرد ئاماژەی پێ بکەم ئەم بابەتانە لەپەیمانگای هونەرەجوانەکان لەگەڵ وانەی سروودو گۆرانیدا بخوێنرێت ئەگەر لەساڵێکی دیاریکراویش بێت هەروەکو چۆن سروود و گۆرانی لەپرۆگرامی خوێندندا گۆرانی منالّیش لەخۆ بگرێت چونکە دەرچووی ئەوێ دەبنە مامۆستای ئەو بابەتە بۆیە پێویستە شارەزای لەگۆرانی مۆسیقای مندالآندا هەبێت بتوانێت خۆی ئاواز بۆئەو قۆناغانە دابنێت و هەروەکو چۆن لەسەردەمی ئێمەدا یەکێك بوو لەبابەتەکانی ئێمە. لەلایەکی ترەوە تائێستا لەقۆناغی سەرەتای بابەتی موزیك کتێبی تایبەت بەوانەی موزیك نییە کەلەولآتی دنیاو تەنانەت لەهەندێ ولآتی عەرەبی دراوسێ عێراق کتێبی موزیك بۆ گۆرانی منالآن و هەندێ زانیاری موزیك و گۆرانی یاری منالآن و ناسینی کۆمەڵێك ئامێری موزیك

بەقوتابیانی قۆناغی سەرەتایی بەشێوەی ئاسان، تەنانەت لەسەردەمی سالآنی حەفتاکان لەعێراقیش کتێبێکی واهەبوو بەلاّم بـۆ مامۆسـتا و خوێنـدکارانی پەیمانگای هونەرەجوانەکان هەبوو بۆئەو وانەیە. لەکۆتایـدا هیـوادارم هـەموو چـمکەکانی هونـەری کوردیمـان بەشـێوازی زانـستی سـەردەمی کۆبکەینـەوە بیخەینە خزمەت هونەرو هونەرمەندان. دەست خۆشیش لەبرای هونەرمەندم ئازاد سالّح ئەکەم کەئەرکی کێشا و ئەم یاری وگۆرانییانەی کۆکردەوە.

**چالاك صديق**

# بەراییەك

منـدالْ...!! ئـەو بونـەوەرە پڕلـە میهـرو پـاكی و بێگـەردە پـڕ ئەفـسووناویەیە، كـە هـەموو دیاردەكـان لای ئـەو نوێیـە، ئـەوەی دەیبیستێت، دەیبینێت، هەستی پێدەكات و لای ئەو ڕەنگدانەوەی تایبەتی خۆی هەیە.

هونەری مۆزیكیش یەكەمین هەستیارە كەمرۆڤ پێوەی پەیوەست دەبێت و كار دەكاتە سەر ژیانی تاك و هەست ونەست و سۆزی ئاوێزانی دەبێت و گۆشی دەكات.

هـەر لەسـەرەتاوە منـدالْ لـە مندالْـدانی دایكیـدا هەسـت بـە ڕەزمـی دڵـی دایـك دەكـات و یەكـەمین ئـاوازیش دەنگـی هەناسـەی سییەكانیەتی، بۆیە لێدانی دلْ و هەناسەی دایك یەكەمین بەزم و ڕەزمە لای مندالْ (الصوت والایقاع) كە كات و ئاواز دوو تـوخمی سەرەكین لە مۆسیقادا.

بنەمای یەكەمی مۆزیك ئاوازە كە بریتییە لە لەرینەوەیەكی شەپۆلدار كە لەهـەوادا بـەهۆی لەرینـەوەی تەنێكەوە (قورگ - ژێ) بلاّو دەبێتەوە، مندالْ لەسەرەتاكانی تەمەنیدا دەنگی مۆزیكی نیە، بەلاّم ئەگـەر پـەروەردە بكرێـت و خولیـای هـەبێت دەنگی دەبێتـە دەنگی موزیكی. دووەم بنەمای مۆزیكیش (ڕەزم)ە، كە بریتییە لەیەك بەدوای یەكدا هاتنی كاتە موزیكیەكان گەر وەك یەك بن یان جیـاواز ڕەزمـیش تـوخمێكی سـەرەكی موزیكـە، چـونكە هـەموو بـوون وگـەردوون لەسـەر ڕەزمێكـی ڕێكوپێـك بەڕێوەدەچـێت هـەر لەسوڕانەوەی زەوی و بەدوای یەكدا هاتنی سالْ و وەرزەكان و مانگ و ڕۆژ و كاتژمێرەكان، تا دەگاتە ژیـانی بوونـەوەرەكان بـەمرۆڤ و ئاژەلأو وتەنانەت ڕووەكیش، كە لەسەر ڕەزمێكی تایبـەت بـەڕێوە دەچێت كە بەشێوەیەكی وورد كۆك كـراوە كـە بەبـەردەوامی ژیان دەپارێزێت كەواتە نەمانی ڕەزم واتە نەمانی ژیان بە هەموو ماناو بەهاكانیەوە. كەواتە مندالْ بـۆ مـاوەی (٩) نـۆ مـانگ لـە نێـو مندالْدانی دایكیدا دەژی وە لەناو هەناویدا هەست بەدەورو بەر دەكات بەتایبەتی دەنگ و ڕەزم زرمەو ترپە كە وەك خۆراكـی گیـانی وایە تا ئەو كاتەی چاو بەدنیا هەلْدەهێنێت و دێتە ژیان، ئەو ساتانە هەست بەنامۆیی و ترس و دلْەڕاوكێ دەكات، بۆیـە بـەگریان ئـەم نامۆییەی خۆی دەردەبڕێت.

پاش ئەمە دایک بەدەنگی بەسۆزی ئەم ترس و دڵەڕاوکێیەی بۆ پڕ دەکاتەوە و بەشێوەیەکی سیحر ئامێز دایک و منداڵ دەبنە تان و پۆی یەکتر و جوانترین سۆزو ئاواز تێکەڵ بە گیانی نامۆی یەکدی دەکەن، لەم تەمەنەدا دایک و منداڵ دوانەیەکی یەکدی ڕازێنەرەوەن ئەم بەدەنگی سۆزی دایکایەتی و ئەو بەگڕو گاڵی پڕ لەبەرائەتی.

کەواتە ئامرازی دەنگ و ڕەزم دەبێتە یەکەمین پردی پەڕینەوەی هەستەکانیان بۆیە ساناترین و ساکارترین گرێ بەند دەنگی بەسۆزی دایکە بۆمنداڵەکەی ئەویش بە لای لایەو گۆرانی و ڕاژەنینی تا بەیانی و پەروەردەکردن بەشیری مەمکەکانی، بۆیە منداڵ بەم دنیا نوێیە ئالودەی موزیک دەبێت.

لێرەدا گرنگی موزیک بۆ گیانی منداڵ و گەشەسەندنی وەك گرنگی شیر وایە بۆ نەشونماکردنی واتە گەشەسەندنی گیانی و جەستەیی (الروحی والمادی) هەردوو تەواوکەری یەکدین بۆ منداڵ، بە شێوەیەکی دی گرنگی موزیک لەوەدایە چونکە دەربڕینی سۆزو هەستە لەهەموو کات و شوێن و زەمەنێکدا، هەر کۆمەڵگایەك هەرچەندە سەرەتایی یان پێشکەوتوو بێت، لێرەشەوە سەرچاوەکانی گۆرانی بەپێی زەمان و زاراوە و جوگرافیاو باری ئابووری و کۆمەلآیەتی جیاواز دەگۆڕێت، لای کۆمەڵگا پێشکەوتوەکان موزیک بووەتە شیوازێک لەژیان بۆیە لای ئەورووپیەکان موزیک بریتی نیە لەوتنەوە و پیاهەڵدان بەڵکو بووە بەژیان.

ئامانجی گۆرانی منداڵیش ئەوەیە کەهەست و نەست و سۆز تیژ دەکات و گەشەی پێدەکات ، دەروون ئاسوودە دەکات بەوەی زانیاری منداڵ لەبواری زمان و یاری کردن و هەروەها مێژووی کلتوورو خەیاڵ فراوان دەکات، چونکە جەستەی خۆی دەدۆزێتەوە و خۆی لەوانی دی جیادەکاتەوە و دەبێتە تاکێکی سەربەخۆ، لەو ساتانەدا فێری ئاخاوتن و ژاوە ژاو و چەپڵە دەکوتێت و وەریشی دەگرێت، واتە کارو کاردانەوە، چونکە منداڵ بەدەنگی بەسۆزی دایکی خەو دەیباتەوە و لەبێشکەدا لەسەر ڕەزمەکەی خەوەی لێدەکەوێت و گڕوگاڵ دەکات و هەڵدەپەڕێنرێت و کاتێ سەمای پێدەکرێت و پاشان دەست دەکات بەڕۆیشتن.

یەکێک لەئامانجە سەرەکیەکانی ئەم توێژینەوەیە پۆلێن کردنی گۆرانی فۆلکلۆری منداڵآنی کوردە بۆ چەند بەشێکی سەرەکی لەوانە:

١- ئەو گۆرانییانەی کە بۆ منداڵ دەوترێت لەسەرەتای لەدیکبوونیەوە تا تەمەنی (٢) دوو ساڵآن (تەمەنی پێگرتنی ڕاستەقینەی)

ئەوەی لێرەدا بەرچاو دەكەوێت ئەم گۆرانیانە لەلایەن گەورەوە ئاوازو هۆنراوەكانیان دادەنرێت، چونكە منداڵ توانای دەربڕینی نیە.

ئاشكرایە ئەم گۆرانییانە لەلایەن دایكەوە دەگوترێت لەبەرئەوەی سۆزی دایك سۆزێكی پڕ میهرەبانی و بەخشندەییە، بەوەی كە سروشتی دایك وا خوڵقاوە كە بۆماوەی چەند مانگێك منداڵەكەی لە سكدا بێت و هەست بەئازارەكانی و خۆشییەكانی دەكات.

گۆرانی ئەم قۆناغەی تەمەنی منداڵ دەكرێت بەدوو بەشەوە:-

أ- گۆرانی خەواندن / وەك لای لایە

ب- گۆرانی گڕو كاڵ / وەك ئش ئش

ئامانجی یەكەمیان یارمەتیدانی منداڵە بۆنووستنێكی ئاسوودە، بەلآم ئامانجی دووەم پڕ باركردن وباركاوی كردنی گیانی خۆشەویستی و ڕاهاتنە لەگەڵ ژیان و دەوروبەر، ئەم جۆرەی گۆرانییەكان زۆر جار بڕگەكانی كورتە وەك دایك منداڵەكە هەڵبەزو دابەز پێدەكات یان خۆی دەجوڵێنێتەوە كاتێك منداڵەكەی لە باوەش گرتووە.

٢- ئەو گۆرانیانەی كەمندالآن خۆیان دەیڵێنەوە لەكاتی یاریكردنە ڕەمەكیەكاندا، ئەم گۆرانییانە زۆر جار لە ڕۆیشتن یان دانیشتن یان كاتی ڕاكردنیان بەبێ ئەوەی سنورێكی دیاریكراوی هەبێت و پلانێك هەبێت، بەڵكو پەیوەندی بە وەرزێكەوە یان بۆنەیەكەوە هەیە.

یاریش خۆی بۆ خۆی بۆ منداڵ پێویستە (ویبستر) لەم بارەیەوە دەڵێت: (ئەو جوڵآنەیە كە خۆشی پەرش دەكات) یان فرۆید دەڵێت: (ئەو جوڵآنەیە كە ئارەزوومەندانە كاتی پێ دەبەینە سەر). یارییە هەڕەمەكیانە ئەو یارییانەیە كە منداڵ دەیكات بەبێ ئەوەی هەستی پێ بكات، بەڵكو لەگەڵ هاوەڵەكانیدا بەتاك یان بەكۆ دەیڵێتەوە، بە شێوەیەكی ساكار هەندێ جاریش هیچ مانایەك نابەخشێت.

یاری ئەو گۆڕەپانە والآیەیە كە منداڵ ناخی كپكراوی خۆی پێ دەردەبڕێت، چونكە ناتوانێت بە وشە ئەو جۆرە هەستەی دەربرڕێت، بۆیە بەیاری و ئامڕازە ساكارەكانی بەردەستی وەك بەرد، دار، بووكەڵە...هتد، ناخی خۆی خاڵی دەكاتەوە.

٣- ئەو گۆرانیانەی کە تایبەتە بەیارییەکی دیاریکراوەوە:- گەر گۆرانی گەورە چەند ڕێسایەکی تایبەتی خۆی هەبێت ئەوا دنیای منداڵیش دنیایەکی کورتکراوەی ژیانی کۆمەڵە و ئەوانیش لەکاتی وازیکردندا چەند گۆرانییەکی تایبەتیان هەیە بە خۆیان، زۆر جار گەورە ئامێرە موزیکیەکان بەکار دەهێنێت، بەلآم ئەمان بەوازیکردن ئەم گۆرانییانە دەردەبڕن، گەر گۆرانی گەورە سۆزێکی عاشقانەی هەبێت بۆ توخمی بەرامبەر ئەمان جوڵە ئاوێزانی ئەو عەشقە دەکەن، واتە زۆر جار کێژان لەتەك گۆرانییەکەدا سەما دەکەن، کوڕانیش چەند جووڵەیەکی ڕاکردنی وەرزشی دەکەنە ئاوێزانی گۆرانییەکانیان.

بەمەدا دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە بتوانین گۆرانی منداڵآن بەم شێوەیەی خوارەوە پۆلێن بکەین:




گەر لەڕووی تیۆریەوە سەیری گۆرانی فۆلکلۆری منداڵآن بکەین دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە دوو جۆر گۆرانی منداڵآن هەیە:

١- ئەو ئاوازانەی کە لەلایەن گەورەوە دەوترێت بۆ منداڵآن بۆ خەواندن زۆربەیان بێ (کێش)ە، چونکە لە سەرچاوەی سۆزەوە ئیلهامی وەرگرتووە.

٢- ئەو ئاوازانەی کەمنداڵآن خۆیان لەگەڵ یارییەکاندا دەیڵێنەوە (کێش)دارن و جوڵەو سەمایان ئاوێزانە




ئەوەی ئاشکرایە زۆربەی ئەو گۆرانیانەی کە لەتەمەنی سەرەتایی منداڵاندا کە لەلایەن دایکەوە دەگوترێت زۆر جار بێ کێشە و لەلایەن دایکەوە دەگوترێت واتە (تاك گۆ)، بەڵام ئەو ئاوازانەی کە لەلایەن منداڵان خۆیانەوە دەگوترێت زۆربەیان بەکۆمەڵ دەگوترێت یان یەکێک لەمناڵەکان دەیڵێت و ئەوانی دی بۆی دەسەننەوە،لە کۆتاییدا دەتوانین گۆرانی کوردی مناڵان بەم شێوەیە پۆلێن بکەین:




تێبینی /

تاك كۆ: واتا بەتاك دەگوترێت

كۆ كۆ: واتا لەلایەن كۆمەڵێكەوە دەگوترێت

(١)



لای لایــه لای لایــه ڕۆڵــه لای لایــه
شــەوگار درەنگــە بــۆ خــەوت نایــە
لایەت بــۆ ئەکــەم خــەوت لێ بکــەوێ
شەو هــەتا بــەیان گیانــت بــسرەوێ
ڕۆڵــە لای لایــە کۆرپــەم لای لایــە
شــەوگار درەنگــە بــۆ خــەوت نایــە

# لای لایە

♩ = 80

کەم ئی بۆ یەت لا یە نا وت خە بۆ گە رەن د گار و شە یە لا لای لە ڕۆ یە لا لای یە لا لای

6

یە لا لای لە ڕۆ وێ رە بس نت گیا یان بە تا هە و شە وێ بکە لی وت خە

10

یە نا وت خە بۆ گە رەن د گار و شە یە لا لای پەم کۆر

ئەم بەیتانە لەلایەن دایکەوە دەگوترێت بۆ منالەکەی، ئاوازەکەش لەلایەن گەورەوە دانراوە. بەیتەکان لەو ساتانەدا دەگوترێت کە منال لە بێشکەدایە و سەرەتای تەمەنیەتی بۆ ئەوەی منالەکەی خەوی لێ بکەوێت. ڕەزمەکەی بریتییە لە هێنان و بردنی بێشکەکە بۆ ئەمسەروئەوسەر هەروەها وردە وردە لەشی منال خاو ئەبێتەوە و چاوی دەچێتە خەو، ئەم لایلایەیە لە ناوچەیەك بۆ ناوچەیەکی دی دەگۆڕێت، بەلآم گرنگ ئەوەیە کە سۆزی دایک لەم دەقانەو ئاوازەکەیدا بە ڕوونی دیارە.

بەم گۆرانییە یەکەمین پەیوەندی ڕۆحی نێوان دایک و جگەرگۆشەکەی دروست دەبێت. ئەم دەق و ئاوازەش دەبنە پردێک بۆ گرێدانی گیانی دایک و کۆرپەکەی.



(٢)

گورگانـــــــــه شــــــــەوێ

گورگانـــــــــه شــــــــەوێ

لــــەماڵی ئێمـــــه دورۆ کــــەوێ

بــــڕۆ بــــۆ مــــاڵی گوڵــــه

گوڵــــه بخــــۆ دڵــــه بخــــۆ

ئەحەش بخه ناو چـاڵێکی قوڵـەوە

گورگانه شەوێ

♩ = 60 ♩=100

ڕۆ ب وێ كه دورۆ وه مه ئێ ی ڵ ما له وێ شه نه گا گور وێ شه نه گا گور

4

وه لە قو كی لێ چا ناو خه ب حەش ئه خۆ ب لە د خۆ ب لە گو لە گو لی ما بۆ

**ئەم گۆرانییە دایک دەیڵێت بۆ مناڵەکەی کاتێ خەوی لێ دەزڕێت یان دەگری، بەم گۆرانییە تۆزێک لەترس دەخاتە دەروونی منالێ بۆ ئەوەی خەوی لێ بکەوێت. بۆ ئەوە مندالەکە وابزانێ دایکی دەیەوێت گورگی بۆ بانگ بکات، بەلآم هەر دڵی نایەت دەڵێ بەگورگەکە لەماڵیان دوور بکەوێتەوە و بڕوات بۆ ماڵی خزمێکی تریان بۆ ئەوەی مناڵەکانی ئەوان بخوات و مناڵەکەی خۆی پارێزراو بێت..**



( ٣ )

ئش ئش پەڵپینە بەترش

# ئش ئش




ئەوەی لەم دەقەدا بەدی دەکرێت لەوکاتانەدا دەگوترێت کە منالّ لەتەمەنی گڕوگالّ کردنیەتی کە دایک منالّەکەی بەهەردوو دەست بەرزدەکاتەوە و ئەم گۆرانییە دەڵێت. لەم دەقەدا وشەی (پەڵپینە بەترش) هاتووە کە خواردنێکی کۆنی کوردەوارییە ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت کە مرۆڤ تەنانەت سوودی لە ناوی خواردن وەرگرتووە بۆ ئەوەی لە دەقی گۆرانی و ئاوازەکانیدا بەکاری بهێنێت. هەروەها وشەی (ئش) کە هێمایەکە بۆ هەڵپەڕکێ و سەما بۆیە ئەم ئاوازە لە کاتی هەڵپەڕاندنی منالّەکەدا دەگوترێت.



(٤)

داره داره          پیٚ بگره بەهاره

# داره داره




ئەم گۆرانییە لەو کاتانەدا دەگوترێت کەمندالّ لەتەمەنی پێ گرتندایە، ئەو کاتانەی کە (ڕەو ڕەوە)❖ی تەختەی دەدرێتە دەست کاتێ کە دەکەوێت و هەڵدەستێتەوە ئەم ئاوازەش لەلایەن گەورەوە دانراوە، منالّ هان دەدات کە پێ بگرێت و لە گاگۆڵکێ کردن ڕزگاری بێت. وشەی (داره) لەوانەیە لە ناوی (دارا) وە هاتبێت یان لە وشەی دار کە نیشانەیە بۆ ڕاوەستان و چەق بەستن لە سەر زەوی و سەقامگیر بوون، لە باری دەروونیەوە لایەنی هاندانی تێدایە بۆ منالّ.

❖ ڕەوڕەوە: بریتییە لەخلۆکەیەك کە لەتەختەدار دروست دەکرێت. ئەو کاتانە دەدرێتە دەست منالّ کە خەریکە پێ دەگرێت، (ئەم ڕەوڕەوە)یە تایبەتە بە پیشەسازییەکانی میللی کوردەواری کە لەنەتەوەکانی تردا جۆرەکانی جیاوازە.



(٥)

هــــۆ ڕێـــوی ڕێـــوی هـــۆو

ڕێـــوی بـــێ ئیمـــان هـــۆو

شـــەریکی شـــەیتان هـــۆو

قەلەکـــە سمـــۆرە هـــۆو

لـــە دەشـــتی چـــۆڵە هـــۆو

# هۆ ڕیوی

♩ = 100

هۆ ڕێ وی ڕێ وی هۆ ۆ ڕێ وی بێ ئی مان هۆ و

3

شه ری کی شەی تان هۆ و قه له که سم ۆ ره هۆ و له دەش تی چۆ له هۆ و

ئەم گۆرانیە زۆرتر مندالآن لە کۆلآن کوڕ یان کچ دەیلێنەوە و ئاوازەکەی لەلایەن مندالآنەوە دانراوە. پەیوەندی نێوان مندالْ و گیاندار دەردەخات کە ڕێوی بە گیاندارێکی فێڵباز دەدرێتە قەڵەم، بە فێڵبازی ڕێوی بێ ئیمانە و هەروەك شەریکی شەیتان وایە هەروەها قەلیش باڵندەیەکی دڕندەیە لای مندالآن، ئەم گۆرانییە بۆ مندالآنی تەمەن (٨ - ٩) سالآنە.



(٦)

پشیله سووره به کوێیا چوو
ئەرزی دڕی پیایا چوو

# پشیله

♩ = 90

پشی له سو ره به کویا چوو ئەر زی د ڕی پیا یا چوو

ئەم گۆرانیەش زیاتر کوڕان لە کاتی هاوین بەتایبەتی شەو دەیان وتەوە کە پشیلە گیاندارێکە لە ماڵآن هەیە کە لەوانەیە لەترسی ڕاونانی مناڵآن هێندە بەتووندی ڕای کردووە لەوانەیە ئازاری (چۆلەکە)ی دابێت عەرزی دڕیوە پێیدا چووە ئەمەش خەیاڵێکی بەرینی مناڵ پیشان دەدات کە خەیاڵآویانە بیر دەکاتەوە ئەم گۆرانییەش بۆ مناڵآنی تەمەن (٦ - ٧) ساڵآنە.



(٧)

سابونی ڕەقی[٥]         پشتم تەقی

---

[5] سابوونی ڕ ەقی، جۆرە سابونێ کە کە لە کاتی خۆی زۆربەی خەڵك بەو سابونە خۆیان شتووە.

# سابونی ڕەقی




ئەم گۆرانیە زیاتر کوڕ یان کچ شەوان لەزستان دەیڵێنەوە ئەمەش وەك یارییەك دەكرێت كە دوو منالٚ پشت دەكەنە یەكترو پشتاو پشت دەست دەگرن وە یەكەم جار یەكەمیان ئەوی تر واتە دووەمیان بەرز دەكاتەوە و دەڵێت: سابونی ڕەقی دووەم جار كەسی دووەم یەكەم بەرز دەكاتەوە و دەڵێت: پشتم تەقی، ئەمەش وەك پشت تەقاندنی یەكتر وایە كە وەرزش دەكەن.



( ٨ )

دگل دگل دانە     شەڕی مامە خانە

## دگل دگل




ئەم گۆرانییە تایبەتە بەشەڕە کەڵەشێر. کاتێک دوو کەڵەشێری مناڵآن دەست دەکەن بەشەڕ خاوەنەکانیان یان مناڵآنی دی کە لێی کۆدەبنەوە ئەم گۆرانییە دەڵێنەوە بۆ هاندانی کەڵەشێرەکانیان کە هەموو پۆپنەی یەکتریان پڕ کردووە لەخوێن. ئەم گۆرانییە بە حەماسەتێکی زۆرەوە دەڵێنەوە بۆ ئەوەی هەریەکە کەڵەشێری خۆی براوە بێت.



(٩)

ئاگری شینی گیایی
بۆ مەیلی برایی
مەیلی برام حەوت پشتە
ئەسپی کاکم لەجووتە
هۆ کچێ تەقە تەق مەکە
گوارەکانت دەفرۆشم
ئەیدەم بە قەرەوێڵە
لە سەری دادەنیشم

## ئاگری شین

♩ = 80

ئاگ ری شی نی گیا یی بۆ مەی لی ب را یی مەی لی ب رام حەوت پش تە ئەس پی کا کم لە پش تە

5

هۆ کچێ تەقە تەق تەق مە کە گوا رە کا نت ئەف رۆ شم ئەی دەم بە قە رە وێ ڵە لە سە ری دا ئە نی شم

ئەم گۆرانییە تایبەتە بە کچان کە دەیڵێنەوە و پشت بە برا بەستراوە، کە کچان پشتیان بەبراکانیان دەبەستن و شانازی پێوەدەکەن ئەم گۆرانییە زیاتر لەوەرزی بەهاردا دەگوترێت، ئەو کاتانەی کە کاتی جووت کردنە.



(١٠)

ئایـــــــشێ بنەوشـــــــێ

گــــسکێ بـــــدە لەحەوشـــــێ

ئــــەگینا دایکـــــت دەتکـــــوژێ

یـــــاخوا لەشـــــت داوەشـــــێ

## ئایشێ




ئەم گۆرانییە تایبەتە بە منالآنی کچ کە هاوڕێکانی (ئایشێ) هان دەدەن بۆ ئەوەی یارمەتی دایکی بدات لە کارکردن هەروەها ترسیش دەخەنە کار بۆئەوەی بەهۆی ترسەوە هانی کچەکە بدەن بۆ کار کە لێدان لە کلتوری کۆمەڵگای ئێمەدا هەبووە ئەویش پەیوەندی بەو کلتورە توندو تیژەوە هەیە کە کۆمەڵگای ئێمە تووشی بووە.



(١١)

مامە پیرە سەعات چەندە
پێم نەگوتن سەعات یەکە
مامە پیرە سەعات چەندە
پێم نەگوتن سەعات دووە
بەم شێوەیە تادەگاتەکاتژمێر دوانزە

مامه پیره

ما مه پی ره سه عات چه نه پێم نه گو ت ن سه عا ت یه كه

ما مه پی ره سه عات چه نه پێم نه گو ت ن سه عا ت دوو وه

ئەم گۆرانییە کۆمەڵێک منالْ کۆ دەبنەوە و یەکێکی گەورەیان جلوبەرگی پیاوی پیر لەبەردەکات و جامەدانەیەك دەبەستێت و خۆی دەکات بە مامە پیرەیەك، منالآنیش لێی کۆدەبنەوە و لێی دەپرسن: مامە پیرە سەعات چەندە؟

ئەویش وەلآمیان دەداتەوە و دەڵێت: پێم نەوتن سەعات یەکە.

ئەوەی ئاشکرایە ئەم گۆرانییە یارمەتی منالْ دەدات بۆ فێربوونی خوێندنەوەی کات.



(١٢)

پرچـــی ئایـــشێ و فاتمـــە
پرچـــم بـــۆ درێـــژ کـــە




ئەم گۆرانییە لە کاتی پاش بارانی بەهار کە پەلکە زێڕینە بەڕەنگە ڕەنگالەییەکەیەوە لە ناو هەوردا دەردەکەوێت کە دیمەنێکی ئێجگار سیحراویی دەنوێنێت، ئەمەش وای لەمندالآن کردووە بەتایبەتی کچان پرچیان بدەنە بەر باران و سەیری پەلکە زێڕینە بکەن و ئەم گۆرانییە بڵێنەوە.



(١٣)

بووکە بەبارانێ<br>
سەعاتی جارانێ<br>
ئاوی میزەڵدانێ<br>
ئاوی بن دەغڵانێ<br>
هەیاران و مەیاران<br>
یاخوا داکاتە باران<br>
بۆ فەقیرو هەژاران

بووكه به بارانێ

♩ = 130

دەغ بن وی ئا نێ ڵا زە می وی ئا نێ را جا تی عا سە نێ را با بە کە بو

8

ران ژا هە رو قی فە بۆ ران با تە کا دا خوا یا ران یا مە نو را یا هە نێ ڵا

ئەم گۆرانییە بە زۆری لەو ساڵانەدا دەگوترێت کە باران کەمە. منداڵان وەك جۆرێک پاڕانەوە و نزاکردن ئەم پرۆسەیە ئەنجام دەدەن کە باران بباریٚ بۆ ئەوەی دەغڵ و دان بژێتەوە.

منداڵان بوکێک لە پەڕۆ دروست دەکەن و لە دەرگای ماڵان دەدەن، تا کەیبانوی ماڵ دەرگایان لێ دەکاتەوە و ئەوانیش ئەم گۆرانییە دەڵێنەوە. کەیبانوی ماڵەکەش جامێک ئاو دەکات بەسەر بوکەکەدا و یەك یەك ماڵان دەگەڕێن و ئەم گۆرانییە دەڵێنەوە.



( ١٤ )

هـــەللور بـــەللور تەكامـــە

زەردو ســــــور و شـــــەمامە

ئـــاوە بـــەرە دەنكـــە زەرە

مێخم كـوتی مـێخ هەڵبـەزی

تیكەی ڕاستی ئـەوەی گـەزی

# هه لوور به لوور

♩ = 75

ره زه که دەن ره به وه ئا مه ما شه رو سو دو زەر مه کا ته ور بەڵ لور هه

4

زی گه وەی ئه تی ڕاس کەی تی زی به هەڵ میخ تی کو خم مێ

ئەم گۆرانییە زۆربەی کات لەزستاندا کە منالّ لەژوورەوە دادەنیشن کوڕو کچ پێکەوە یەکێک لەمناڵەکان ئەم گۆرانییە دەڵێت و هەموو مناڵەکان قاچیان درێژ دەکەن. ئەو مناڵەی کە ئەم گۆرانییە دەڵێت یەکە یەکە دەڕوات لەقاچی مناڵەکان دەدات بەدەستی تا کۆتایی بە ئاوازەکە دێت پاشان کە گوتی (ئەوەی گەزی) ئەو قاچەی دەنوشتێنێتەوە، ئەو مناڵەی تا کۆتایی قاچی بەدرێژکراوەیی دەمێنێتەوە و ئەوەیان یارییەکە دەباتەوە.



( ١٥ )

ئاخـــــچی بوخـــــچی
دایـــەو بابـــە ســـندوق چـــی

# ئاخچی بوخچی




ئەم گۆرانییەش منالآن دەیلێنەوە و خۆشەویستی و سۆزی دایک و باوك دەردەخات کە منالآن جگەر گۆشەی ئەوانن وە ئەوان یان باوك خەرجی منالەکان دابین دەکەن وەك سندوقچیەك پارەیان بۆ خەرج دەکات بۆ ژیانیان.



( ١٦ )

حاجی لـەق لـەق مـار هـات

مـــاری ژەنـــگ و ژار هـــات

لـــەیلێ بـــەگریان هـــات

پـــیرەژن بەگۆچـــان هـــات

## حاجی لەق لەق

♩ = 80

حا جی لەق لەق مار هات ما ری ژەن گو ژار هات لەی لێ بە گر یان هات پی رێ ژن بە گۆ چان هات

ئەم گۆرانییەش پەیوەندی نێوان منالّ و گیاندار دەردەخات کە حاجی لەقلەق باڵندەیەکی خێرخوایە و ماریش خشۆکێکی زیانبەخشە، لەلایەکی ترەوە (لەیلێ) ناوی ئافرەتە و لەوە دەچێت کە پیرەژن لێی دابێت ئەمەش دوو لایەنی خێرو شەڕ بەدی دەکرێت لە ڕوانین بۆ ژیان کە تەنانەت لای منالّیش ڕەنگ دەداتەوە.




ئەم گۆرانییە دوو منالْ یەکێکیان ئەوەی تریان هەڵدەگرێت و دەیگرێتە کۆڵی و ماوەیەك دەڕۆن ئەم دەڵێت گەیشتین ئەوەی کە هەڵی گرتووە دەڵێت نەگەیشتین. بەم شێوەیە ئەم گۆرانییە دەڵێنەوە تا دەگەنە ئەو شوێنەی کە لێی هاتوون کە پێی دەڵێن (شار).



( ١٨ )

حەمـامۆکێ مـووم بۆ دەرکێ

مووی زەرد و سورم بۆ دەرکێ




ئەم یارییە منالێک هەندێک خۆڵ کۆدەکاتەوە و وەك گومەزییەکی لێدەکات و تەڕی دەکات و بەئاو سواغی دەدات. ئەو کاتەی دەست دەهێنێت بەسەر گومەزە سواغ دراوەکەدا دەڵێت: حەمامۆکێ مووم بۆ دەرکێ. لەوانەیە ئەو قوڕەی مووی تێدا بێت لە پڕ دەڵێت: ئەرەوەڵآ موویەکم بۆ دەرچوو، واتە لەخەیاڵیدا وادەزانێت کە ئەو مووە بەو گۆرانییەی ئەو دۆزراوەتەوە. ئەوەش پاکی و بێگەردی و خۆش باوەڕی منالّ دەردەخات.



( ١٩ )

دۆزە دۆزە بــــۆم بــــدۆزە

هی خۆم نییە هی پــیرۆزە

## دۆزە دۆزە




ئەم گۆرانییەش کاتێک منالّ دەیڵێت کە شتێکی لێ ون دەبێت لەوانەیە کە پارەی ڕۆژانەکەی بێت کە خەرجی دەکات یان گوارەیەکی ئاڵتونی بێت، بەبارێکی دەروونی ئاڵۆزەوە دەیڵێت، چونکە لەوانەیە لەدایکی یان کەسێکی گەورەی خێزانەکەی بترسێت بۆیە پەنا دەباتە بەر قەدەر بۆئەوەی خۆی لەو مەسەلەیە دوور بخاتەوە و دەڵێت: هی خۆم نییە هی پیرۆزە لەوانەیە ناوی دایکی بێت.



( ٢٠ )

چـــوومه مـــالّی جولەكـــه
قوڵپـــه قـــوڵپی كولەكـــه
چـــوومه مـــالّی ئەرمـــەنی
قوڵپـــه قـــوڵپی ســـەمەنی
چـــوومه مـــالّی موســـڵمان
دەنگـــی ئايـــەتی قورئـــان

## چومه ماڵی

♩ = 80

چو مه ما لّی جو له که قوڵ په قوڵ پی کو له که نی مه ئەر لّی ما مه چو

قوڵ په قوڵ پی سه مه نی چو مه ما لّی مو سوڵ مان دەن گی ئا یه تی قور ئان

ئەم گۆرانییە منالآن دەیڵێنەوە ئەمە دەریدەخات کە لەکۆمەڵگای کوردەواریدا کورد وەك ئاین لەگەڵ جوولەکەو ئەرمەنیدا وەك برا پێکەوە دەژیان بەوەی کە ناویان لەم هۆنراوەدا هاتووە وە هەریەکە ڕێو ڕەسمی جیاوازیان هەبووە لە ژیاندا.



( ٢١ )

شەوی شەوی بەراتێ
خوا دوو کوڕو کچێکتان باتێ
کچەکەتان ژیر بێ
کوڕەکەتان میر بێ
ئەگەر هەیە بەزیاد بێ
ئەگەر نییە بەزیاد بێ
بەشی ئێمەشی تیا بێ

## شەوی بەراتێ

♩ = 100

تان كه ڕه كو بێ ژیر تان كه چه ك تێ با تان كچێك كوڕو دوو خوا تێ را به وی شه وی شه 8

بێ تیا شی مه ئی شی به ب زیاد به یه نی گەر ئه بێ زیاد به یه هه گەر ئه بێ میر

شەوی بەرات شەوێکی ئایینیە. لەم شەوەدا کوڕو کچ بە ماڵآندا دەگەڕێن و پێکەوە ئەم گۆرانییە دەڵێنەوە. هەر ماڵەی نوقڵ یان گوێز یان خورما یان پارە دابەش دەکات بەسەر مناڵآندا، دەبینین لەم دەقانە کە منداڵ هەمیشە مرۆڤێکی چاکەخوازە کە لە خوا دەپاڕێنەوە کە کوڕ و کچیان بداتێ کە کچەکە ژیر بێت و کوڕەکە میر بێت وهێندەش چاو چنۆك نین، بەڵکو چەند دەنکە نوقڵێکیان دەدرێتێ ئەگەر هەبێت ئەگەر نەشبێت هەر دەڵێن بەزیاد بێت و داوای بەشێکی کەم دەکەن ئەوەش ئەوە دەسەلمێنێ کەمنداڵ بەرچاوی تەنگ نیە، بەڵکو بەبەشێکی کەم ڕازییە. ئەم هۆنراوە و ئاوازەش هەر لە داهێنانی منداڵ خۆیەتی.



( ٢٢ )

هـــۆ مامـــە ڕەشـــە هـــۆو

پـــشتوێن کرێـــشە هـــۆو

بەردەرگاکـــەتان هـــۆو

هـــەر خۆڵـــە مێـــشە هـــۆو

## هۆمامە ڕەشە

♩ = 100




**ئەم گۆرانیە منـاڵان لە دەرەوە لە گەڕەك ئەیڵێـنەوە کە کەسێك دراوسـێ یـانە بە نـاوی (مـامە ڕەشـە) وە کەسێکی ڕێك پـۆش و پۆشـتەو پەرداخە و پشتوێنەکەی لە قوماشی (کرێش )ە کە جۆرێکە لە قوماشی کراسی ژنانە، بە شان و باڵیداهەڵ ئەدەن و بەم گۆرانی و ئاوازە وەسفی دەکەن.**



( ٢٣ )

دم دم هـــــــەلاجی

نـانێ بـدە بـە تـا نجی

تـوو سەری مامـە حـاجی

## دم دم




جاران هەلاجەكان بەمالآندا دەگەڕان بە ئامێرێكی هەلاجی دۆشەك و لێفەیان بۆ مالآن شی ئەكردەوە ئامێرە هەلاجیەكە یەكێكە لەئامێرە پیشەسازییە كوردەوارییەكان كەبریتی بوو لە دارێكی درێژ وەك كەوان چەمابووەوە و ژێیەكی پێوە بوو كە لەڕیخۆڵەی ئاژەڵ دروست كرابوو، كوتەكێكیشی پێبوو بەدەستی ئەیدا لەژێیەكە و لۆكەی ئەخستە سەری و شی ئەكردەوە. لەو كاتانەدا منالآن ئەم گۆرانییەیان دەگوت كە هەلاجەكە لۆكەی شی ئەكردەوە، زۆر جار هەلاجەكە لەمالآن دەمایەوە و نیوەڕوان لەو ماڵە نانی دەخوارد تا كارەكەی ئەنجام دەدا.



( ٢٤ )

فـــــين كـــــلان كـــــۆ

شـــــــەلا مـــــــەلا دۆ

لەپاكی كە لە پیسی کـە

فـــــين كـــــلان كـــــۆ

## فین کلان کۆ




ئەم گۆرانییە یارییەکە منداڵان بۆ هەڵبژاردن دەیکەن واتە: کێ یەکەم بێت یان دووەم یان سێیەم. منداڵان سێ کەس دەستی یەکتر دەگرن و سێ گۆشەیەك دروست دەکەن. هەموویان سێ چوار جار بەدەست گرتنەوە ڕوو دەکەنە یەك و سێ چوار جار دەستیان دەهێنن و دەیبەن، پاشان دەستیان بەردەدەن وهەریەکە دەست بەشێوەیەك دادەنێت لەو کاتەدا ئەم گۆرانییە دەڵێنەوە تا گۆرانییەکە تەواو دەبێت ئینجا دەست بەردەدەن و ئەو کەسەی دەستی جیاواز دانابوو، دەبێت بە(بەگ)، پاشان جارێکی تر ئەم گۆرانییەو دەست ڕاوەشاندنە دووبارە دەکەنەوە تا کەسی دووەم دەردەچێت دەبێت بە (پاش بەگ) پاشان کەسی سێیەم دەمێنێتەوە دەبێت بە (قڕە).

ئەم گۆرانییە بۆ ئەوەیە کە کام لەو منداڵانە یەکەم جار یاری دەکات.



( ٢٥ )

کیــــژ کیــــژی هەڵە بجەیـــە

زۆر بــــەلارو بەلە نجەیــــە

کیــژ کیــژی سـلێمانی یــە

سـێوە سـوورەی لای کانییــە

کیــــژ کیــــژی بەغایـــــە

تــــــەزبیحی کارەبایــــــە

کیــــژ کیــــژی هەورامانـــە

چاویان ڕەش و بەژنیان جوانە

کیــــژ کیــــژی کەرکوکـــە

ڕازاوەیــــــە وەك بوکـــــە

## کیژ کیژی

♩ = 85

ه نی کا لای ڕەی سو وە سێ یە نی ما سلێ ژی کی ژ کی یە جە لەن بە رو لا بە زۆر یە جە ڵەب هە ژی کی ژ کی

5

نە ما را هەو ژی کی ژ کی یە با رە کا حی بی تەز یە غا بە ژی کی ژ کی

8

کە بو وەك یە وە زا ڕا کە کو کەر ژی کی ژ کی نە جوا نیان بەژ شو ڕە یان چاو

ئـەم گـۆرانییـە منـالآن بەتایبـەتی کـچان دەیلێنـەوە و هـەموویان پێکـەوە دەسـت دەگـرن و دەیلێنـەوە و هـەرجارەی وەسفی جـوانی ناوچــەیەك دەکــەن و کیــژانی هــەر ناوچــەیەك بــە شــتی جــوان دەشــوبهێنن. ئــەم ئــاوازەش هــەر منــالآن خۆیــان داهێنــەرین و شوبهاندنەکەشیان زۆر جوانـە وەك ئـەوەی (کـیژی هەڵەبجـە – بـەلارو لەنجـە) (کـیـژی سـلێمـانی – سـێوە سـوورە) (کـیـژی بـەغـدا – تەزبیحی کارەبا) (کیژی هەورامـان – چاو ڕەش و جوان). لەم داهێنانەشدا منالآن خەیاڵیان جوان و ناوازەیە.



( ٢٦ )

ئیـــستعلا فـــات فـــات

وزیـــل وســـەبع لـــەفات

ڕێـــوی یەکـــــە ڕۆی ڕۆی

کلکەکەی حەوت جـار ڕۆی

### ئیستەعلا

♩ = 90

ڕۆی جار حەوت کەی کە کل ڕۆی ڕۆی کە یە ڕێو فات لە بەع سە لو زێ و فات فات لا تەع ئیس

ئەم گۆرانییە لە زمانی عەرەبی بەم شێوەیە: (**الثعلب فات فات وذيله سبع لفات**)، بەڵام کراوە بەکوردی ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە منداڵی کورد جگە لە یارییە کوردەوارییەکان یاری نەتەوەکانی دیکەشیان بەکارهێناوە.



( ٢٧ )

هۆ چەرمە چەرمە چەرمە

حێولانێ

حەز لەبووکێ خۆ شەرمە

حێولانێ

بوکـــم دی حـەلاڵـــم بــێ

حێولانێ

لەگەڵ عوســـە لاڵــــم دی

حێولانێ

هەرهێناى و هەر بردی

حێولانێ

بوك لەخۆى مارەكردی

حێولانێ

## هۆ چەرمە

♩ = 140

8

14

حه دی کم بو نێ لا و حێ مه شەر خۆ کێ بو لە حەز تێ لا و حێ مه چەر مه چەر مه چەر هۆ

ییو نا هێ هەر نێ لا و حێ دی لّە لا سه عو گەڵ لە نێ لا و حێ بێ لم ڵا

نێ لا و حێ دی کر ره ما خۆی لە بوک نێ لا و حێ دی بر هەر

ئەم گۆرانییە کۆمەڵێک لەکچان بەشێوەیەکی بازنەیی دەخولێنەوە و دەست دەگرن یەکێکیان بەیتەکە دەڵێت و ئەوانی تریش بە کۆرس هەموو پێکەوە دەڵێن: (حێولانێ). بەم شێوەیە ئەم گۆرانییە دەڵێنەوە تا ماندوو دەبن، چونکە بەشێوەیەکی هەڵپەرکێ دەخولێنەوە بە دەوری یەکتردا.



( ٢٨ )

**پـاس پـاس ئـەسـتێرە**
**قـومـری لـەسـەر ئەسـتـێرە**




ئەم گۆرانییە کۆمەڵێک کچ یەک بەدوای یەکتردا دەستیان درێژ دەکەن بۆ سەر شانی یەکتری و دەست دەکەن بەڕۆیشتن و سەریان دادەنوێنن و ئەم گۆرانییە دەڵێنەوە.



( ٢٩ )

پاپ پـاپ پـە پـە پـاپ

دیـــد دیـــد دی دی دیـــد




ئەم گۆرانییە کۆمەڵێک کوڕ خۆیان دەکەن بەشۆفێر بۆ بووک بردن. شەش حەوت منداڵ بەدوای یەکدا بەدەم ئۆتۆمبێل لێدەخوڕن و دەستیان دەکەن بە سوکانی ئۆتۆمبێل و هەر بەدەمیش گێڕ دەگۆڕن و هەمووی بەدوای یەکدا وەك ئەوە وایە ئۆتۆمبێل لێبخوڕن و هەموویان ئەڵێن (پاپ پاپ). ئەمە وەك ئەوە وایە هۆڕن بۆ بووک بردن لێ بدەن. ئەمەش ئەوە نیشان دەدات کە منالآن خۆیان لە خەیاڵێکی خۆشدا دەبیننەوە کە ئۆتۆمبێلێکی ڕاستەقینە لێدەخوڕن. ئەمەش یەکێک لە خەیاڵە بەربلآوەکانی منالآن دەردەخات.



( ٣٠ )

ئانــه پانــه له پانــه
ورد الاحمــــر شــــفانا
ئـــان پـــــان پــــف
ئـــان پـــــان پــــف

ئانە پانە

♩ = 90




ئەم گۆرانییە لەوە دەچێت کە عەرەبی بێت، بەلآم هێندە دەزانم کە منالآن بەتایبەتی کچ ئەم گۆرانییەیان دەگوتەوە.

کۆمەڵێک منالٚ پێکەوە دەستیان دەگرت و هەڵدەپەڕین لەگەڵ تەواوبوونی گۆرانییەکەدا منالآن خۆیان دەدا بەئەرزدا و دائەنیشتن.

( ٣١ )



حــل حلــی بــل بلــی
چــاوم ڕەشــتووە بــەکلی
کلــی نــەبوو صــۆفی بــوو
لــە ماڵەکــەی تــۆپی بــوو
صــۆفی چــوو بــوو ژن بێنــێ
ژنــی شــەفە گــول بێنــی
شــەفە گــولم کوتــاوە
لەموســڵ بــەرم داوە
موســڵ خــشتاو خــشتە
شــیری کــاکم لــە پــشتە
عەتەکــە عەتەکەمــەگری
هەســتە بــچینە قــەبری
قــەبری تــەنگو تــارە
پڕلەمــشك و مــارە
مــشك و مارخرا پــە
ســەریان بــە قولا پــە

# حل حلی

♩=80

5

9

13

بو پی تۆ کەی ڵە ما لە بو فی سۆ بو نە ی کل ی کل بە توە ڕش وم چا ی بل بل ی حل حل

وە دا رم بە سڵ مو لە وە تا کو لم گو فە شە نێ بێ گول فە شە ی ژن نێ بێ ژن بو چو فی سۆ

ری قەب نە بچی تە هەس ری مەگ کە تە عە کە تە عە تە پش لە کم کا ری شی تە خش تاو خش سڵ مو

پە لا قو بە یان سەر پە را خ مار کو مش رە ما کو مش لە پڕ رە تا گو تەن ری قەب

**ئەم گۆرانییە زیاتر کچان دەیان ووت لە کۆڵان و گەڕەك .کە باسی چاو ڕشتن بە (کل) ئەکات و باسی ژن هێنانی سۆفیەك ئەکات**

( ٣٢ )



عەلیم بەگ، لام بەگ
منالّەکان چوون بۆ کوێ ؟
چوون بۆ باغی میر
چیان برد؟ برمە
چی تریش؟ خورما
بەچی ڕۆیشتن ؟
بەعەرەبانەی تەل
چەن تەلی پێوە بوو ؟
سەد تەل
چەندی بۆ من ؟ چەندی بۆ تۆ؟
پە نجای بۆ من پە نجای بۆ تۆ
بووکەکەمان ناوی چی یە ؟ ناوی گولّەیە
بەدم بیبەین یان بە زم
بەدم و زم
دم دم یاخوا موبارەکی بێت
زم زم یاخوا موبارەکی بێت

# عەلیم بەگ

♩=80

مه بور برد ن یا چ میر خی با بۆ چون کۆیٚ بۆ چون کان لە نا م بەگ م لا بەگ لیم عە

9

من بۆ دی چەن تەل سەد بو وە پی لی تە چەن تەل ی نە با عەرە بە تن ڕۆش چی بە ما خور یش تر چی

17

بەین بی دم بە یە لە گو وی نا ە چی وی نا مان کە کە بو تۆ بۆ جا پەن من بۆ جای پەن تۆ بۆ دی چەن

25

بێت کی رە با مو خوا یا زم زم بێت کی رە با مو خوا یا دم دم زم مو د بە زم بە یان

تاقمێک منالّ (کورو کچ) له کۆلآن کۆدەبنەوە. له منالّەکاندا سێ کەس لەگەورەکان هەلّدەبژێرن و دەستی یەکتری دەگرن و فین کلان کۆ دەکەن. ئەو منالّەی یەکەم جار دەردەچێت ئەبێت بەبەگی یەکەم، ئەوەی دوای ئەو دەردەچێت دەبێت به بەگی دووەم وکەسی سێیەم دەچێتەوە ناو کۆمەلّە منالّەکە و دەستی یەکتر دەگرن و نیوە بازنەیەك دروست دەکەن، بەگی یەکەم لەبەشی دەستە ڕاستەوە دەستی منالّی سەرێکی نیوەبازنەکە دەگرێت و دەستەکەی تریشی بە دیوارەکەوە دەگرێت. بەگی دووەمیش لە دەستە چەپەوە دەستی منالّی سەرەکەی تر دەگرێت و دەستەکەی تریشی بەدیوارەکەوە دەگرێت.

بەگی یەکەم: عەلیم بەگ

بەگی دووەم: لام بەگ

یەکەم: منالّەکان چوون بۆ کوێ؟

دووەم: چوون بۆباخی میر

یەکەم: چیان برد؟

دووەم: برمە

یەکەم: چی تر؟

دووەم: خورما

یەکەم: بەچی ڕۆیشتن؟

دووەم: بەعەرەبانەی تەل

یەکەم: چەند تەلی پێوە بوو؟

دووەم: سەد تەل

یەکەم: چەندی بۆ من؟ چەندی بۆ تۆ؟

دووەم: پەنجای بۆ من پەنجای بۆ تۆ

یەکەم: بووکەکەمان ناوی چییە؟

دووەم: ناوی گوڵەیە

یەکەم: بەدم بیبەین یان بەزم؟

دووەم: بەدم و زم

بەم شێوەیە بووکەکە دەبەن.

نیوە بازنەکە دەکرێت بەدوو بەشەوە، بە شێکیان سەر بەبەگی یەکەمە و بەشەکەی تریان سەر بەبەگی دووەم، بەگی یەکەم دەڕوات و تاقمەکەی بەدوایدا بۆ ئەوەی لە نیوە بازنەکە بپچڕێن بەدەم گوتنی دم و زم بەژێر باڵی بووکەکەدا تێپەڕ دەبن، بوکەکەش بەو دیوەدا کە ئەوان ڕوویان لێیە ڕوو وەرئەگێڕێ، بۆ ئەوەی کە نیوەکەی تر دەست بەربدات، کە ڕوویان لە دیوێکی تردایە. پاشان لە کاتی گوتنی گۆرانیەکەدا کە بووکەکەیان برد دەڵێن دم دم یاخوا موبارەکی بێت... زم زم یاخوا موبارەکی بێت.بەم شێوەیە یارییەکە سەر لەنوێ دەستپێدەکاتەوە.



( ٣٣ )

کـەڵـەشـێرو با ڕۆکە
ماڵـمان وا لەو گەڕەکە
سەعدی سەعدی وەرەوە
نانـمان لەگەڵ بکەرەوە
بەیانی دەچین بۆ سەیران
بـۆ ناو سـڵق و باینجـــان

## کەڵەشێرو باڕۆکە

♩=90

وه ره وه دی سەع دی سەع كه ڕه گه لەو وا مان ماڵ كه ڕۆ با رو شێ لّه كه

7

جان ین با قو سڵ ناو بۆ ران سەی بۆ چین ئه نی یا به وه ره بكه گەڵ له مان نان

**ئەم گورانیەش هەر باسی مریشک و کەڵەشێر و هاوکاری کچان لە گەڵ یەکتر دەکات و بۆ ئەوەی بچنە سەیران بۆ ناو بێستانی سلّق و باینجان**



( ٣٤ )

ئەم لای ماڵمان تۆڵەکە [٦]
ئەولای ماڵــمان تۆڵەکە
فــاتە نەرم و نــۆڵــەکە
ئەگەر ئەو خانگە ڕوخیا
خۆم ئەبم بە کــۆڵــەکە

---

[6] ئەم گۆرانیە تایبەتە بە ناوچەی شارەزوور وە هاوڕ یم کاك محمود ئەحمەد بۆی ناردم

ئەم لای ماڵمان تۆڵەکە

♩=80

ئەم لای ماڵ مان تۆ لە کە ئەو لای ماڵ مان تۆ لە کە فا تە نەر مو نۆ لە کە ئە گەر ئەو خا

8

نگە ڕو خیا خۆم ئە بم بە کۆ لە کە ئە گەر ئەو خا نگە ڕو خیا خۆم ئە بم بە کۆ لە کە



( ٣٥ )

**مەتەڵ مەتەڵ مەتیزە[٧]**
**گا کوڵی حەمەی عەزیزە**
**نە گەڵی هەیە نە گــوان**
**شیر ئەدا بە گشت جیهان**

مەتەڵ

♩=75

ڵمان سو مو گشت بە دا ئە شیر وان گ نە یە هە ڵی گە نە زە زی عە مەی حە ڵی کو گا زە تی مە تەڵ مە تەڵ مە

---

(7) ئەم گۆرانیەش تایبەتە بە ناوچەی شارەزوور، لە شێوەی مەتەڵ وتراوە کە مەتەڵەکە (مەشکە) یە.

# چەند سەرنجێك لە گۆرانی فۆلكلۆری منالانی كورد

**لەڕووی دەروونی و كۆمەڵناسیەوە (سایكۆلۆجی و سیسیۆلۆجیەوە).**

**١) ئەوەی ئاشكراو دیارە زۆربەی ئەم گۆرانییانە لەتەمەنی یەكەمی منالی چ ئاواز چ هۆنراوە لەلایەن گەورەوە دانراوە بەتایبەتی دایك چونكە تێكەڵی منالْ زیاتر لەگەڵ دایكیدایە پاشان كاتێ منالْ گەورە دەبێت خۆی دەبێتە خاوەنی ئاوازو هۆنراوەو یارییەكانی خۆی، بۆ نمونە كاتێ منالْ پێدەگرێت ئەو كاتەی نازانێت ئاوازو هۆنراوە دابنێت، گەورە ئەم ئاوازە دەڵێت و لەگەڵ پالْپێوەنانی رەورەوەكەیدا دەڵێت (دارە دارە، پێ بگرە بەهارە)**

**گەر سەرنج بدەین دەبینین (سۆزی دایک) زاڵە بەسەر ئەو گۆرانیانەی كە لە تەمەنی سەرەتایی منداڵدایە ،ئەوەش پەیوەستە بەوەی كە دایک نزیكترین بوونەوەرە لە منالەوە.**

**٢) ئەوەی كە لەگۆرانی منالاندا ڕەچاودەكرێت كە زۆربەی گۆرانییەكانی كوڕ و كچ پێكەوە یاری دەكەن و گۆرانییەكان دەڵێنەوە، كەواتە كۆمەڵگەی كوردی لەسەرەتای سەدەی بیستەم رێگای داوە كە منالْ لە منالییەوە تێكەڵاوی یەكتربن، بەڵام دەبینین لەیارییە فۆلكلۆرییەكاندا كە زۆرتر جوڵەی تێدایە یاری كوڕان لەگەڵ یاری كچان جیاوازە، وەك ماڵە باجێنە، خەتخەتێن، هەڵمەقۆ بۆ كچ و یەكەوحەیزەران، یەكەوگۆتەكەو فرێوە و هەلوكێن بۆ كوڕ، نمونە بۆ ئەو گۆرانییەی كە كوڕ و كچ پێكەوە دەیڵێنەوە:**

**أ ) پشیلە سوورە بەكوێیا چوو ئەرزی دڕی و پیایا چوو**

**بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت كە كوڕ یان كچ گۆرانی تایبەتی خۆی نییە، بۆ نمونە كوڕان حەز لە شەڕە كەڵەشێڕ دەكەن و لەكاتی بەگژاچوونی كەڵەشێرەكان ئەم گۆرانییە دەڵێن**

**ب) دگل دگل دانەشەڕی مامە خانە**

**یان كچان پێكەوە یاری دەكەن و ئەم گۆرانییە دەڵێن**

**نمونە:**

ج) ئاگری شینی گیایی      بۆ مەیلی برایی

نمونەیەکی تر بۆ گۆرانییەك کە کچان پێکەوە دەیڵێنەوە:

د) ئایشێ بنەوشێ      گسکێ بدە لە حەوشێ

٣) گۆرانی منالاَن لەگەڵ وەرزەکانی ساڵ دەگۆڕێت بۆ نمونە ئەو گۆرانییانەی کە لەزستان دەگوترێن جیاوازە لەباران بڕان، چونکە هاوینان بەڕۆژ یان شەو دێنە گۆڕەپان و کۆڵان.

بۆ نمونە گۆرانی مامە پیرە لە هاوین ىان لەبەهار دەگوترێ کەمناڵ خۆی دەکات بە مامە پیرەو گۆجانێك دەگرێت بەدەستیەوەو سەعاتێك دەکاتە دەستی و منالاَنیش بە گۆرانییەوە لێی دەپرسن:

مامە پیرە سەعات چەندە      پێم نەگوتی سەعات یەکە

نمونە لەگۆرانی باران بڕان، کاتێ کە باران ناباریێت منالاَن لەپەڕۆ بووك دروستدەکەن و بەمالاَندا دەگەڕێن، کەیبانووی ماڵەکەش جامێك ئاو دەکات بە بوکەکەداو منالاَن بە یەکەوە ئەم گۆرانییە دەڵێن:

بووکە بەبارانێ      سەعاتی جارانێ

یان شەوانی زستان کە منالاَن بەڕیز دادەنیشن هەموویان قاچ رادەکێشن، یەکێك لە منالاَن دەست دەخاتە سەر قاچیان، یەکە یەکە لەگەڵ گۆرانییەکەدا دەڕوات و دەڵێت: (ئەوەى گەزی). ئەو منالە قاچی دەنوشتێنێتەوە، بەم جۆرە تا کۆتایی گۆرانییەکە:

هەللور بەللور تەکامە      زەردو سوور و شەمامە

یان:

ئاخچی بوخچی      دایەو بابە سندوقچی

هەروەها گۆرانی (سابوونی رەقی) کە لە زستان لە ژوورەوە منالاَن پشت دەکەنە یەکتر و هەردووکیان یەکتر بەرز دەکەنەوە و دەڵێن:

سابوونی رەقی      پشتم تەقی

٤) لەڕووی هۆنراوەوە دەبینین زۆربەی گۆرانیەکان لە گەڵ گیاندار دەدوێ، ئەمەش پەیوەندی بەبیرکردنەوەی ساکاری مندا ڵ دێت کە سود لە بەرجەستەیی دەبینین نەک نەبینراوەکان ،ئەویش هەڵس و کەوتیەتی لەگەڵ ئاژەڵ و باڵدار (ڕێوی –پشیلە –حاجی لەق لەق –– هتد )

وەك:

هۆ رێوی رێوی هۆو رێوی بێ ئیمان هۆو

یان:

حاجی لەقلەق مار هات ماری ژەنگ و ..

لەیلێ بە گریان هات پیرەژن بە گۆچان هات

٥) زۆربەی گۆرانی منالانی کورد لەگەڵ یاری کردندا تێکەڵە لەوانەیە ئەو یارییە بووبێتە هۆی داهێنانی ئاوازو هۆنراوەکە، کە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە مۆسیقاو یاری کردن و سەما پەیوەندییەکی گرێدراویان پێکەوە هەیە و دەچێتە ناوناخی مرۆڤەوەو کاری لێدەکات.

٦) گەر چاوێکی وورد بخشێنین بەناو گۆرانیەکاندا دەبینین هەمیشە دوو بەرە هەیە (بەرەی چاکەو خراپە –الخیر والشر)وەک (شەیتان بەرەی شەڕە– ڕیوی فێلبازە گورگ – –حاجی لەق لەق بەرەی چاکەیە –هتد)

٧) لەڕووی هۆنراوەوە زۆربەی هۆنراوەکان سادەن، هەروەها منالان لاسایی دەوروبەر دەکەنەوە، جاری واهەیە لەوشەکان تێناگەن و ئەیلێنەوە بۆ نمونە تەنانەت منالانی کورد بەهۆی تێکەلاوییان لەگەڵ منالانی عەرەبدا ئەم گۆرانییە منالانەی عەرەبیان دەگوتەوە، کە بەم شێوەیەیە:

استعلا فات فات ئیزیل و سەباع لەفات

کە خۆی بەعەرەبی بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

الثعلب فات فات وذیله سبع لفات

٨) له ڕووی وشەکانەوە زۆربەیان سادەو ساکارن یان وشەی وایە مانای نیە
بەڵام بۆ گونجاندن لەگەڵ ئاوازەکە بەکاریان هێناوە کە زادەی خەیاڵی خۆیانە
٩) له ڕووی ڕەزم و ڕیتمەوە:

زۆربەی ئاوازەکان ئیقاعی سادەن (الوزن البسیط) ئەویش ڕەزمی ٢/٤ یان ٤/٤ ، بەدەگمەن ڕیتمی تێکەڵاو (الوزن المرکب) بوونی هەیە، وەك ٦/٨ لە گۆرانی (مامە پیرە)، هەروەها زۆربەیان یەك ڕیتمن لەخاو تا خێرا لە سەرەتای گۆرانییەکە تا کۆتایی گۆرانییەکە.

١٠) زۆربەی ئەو کاتە مۆسیقایانەی کە لە گۆرانییەکاندا بەکارهاتوون ئەو کاتانەن کە منداڵ بە ئاسانی بۆی دەگوترێت وە بلانش( 𝅗𝅥 ) یان نوار ( ♩ ) یان کروش (♪) وە یان بەدەگمەن دەبڵ کروش ( 𝅘𝅥𝅯 ) بەکاردەهێنرێت، چونکە کاتێکی خێراییە و بۆ منداڵ ئاسان نییە. جارجارەش نیشانەی پشوو (علامة السکوت) ( 𝄽 بەکاردێت، چونکە منداڵ هەناسەی کورتە.

١١) لەبەر ئەوەی چینی دەنگی منداڵانی کچ (سۆپرانۆ – تیژە) ئەو گۆرانییانە لەکاتی وتن و نوسینەوەدا لەو چینە دادەڕێژێت. بەڵام زۆربەی کوڕان دەنگیان چینی (تینور)ە

١٢) لەرووی مەودای دەنگەوە (المسافةالصوتیة) زۆربەی ئەو گۆرانییانە مەوداکانیان لەیەك (تتراکورد) واتە چواردەنگ تێناپەڕێت وە هەرگیز (ئۆکتاف) octave هەشت دەنگ تەواوناکات، وەبگرە زۆربەیان لەیەك دوو تۆن جێگیر دەبن، مەگەر باز (قفزة) بدەن بۆ چوارمیانە (مسافة رابعة) لەخوارەوە پێی دەڵێن (حرکە نازلە) (صوڵ دۆ) یان بە پێچەوانەوە (دۆ صۆڵ ) کە مەوەایەکی پێنج یە یان مەودای سێ دەنگی (مسافة ثالثة) سەرکەوتن (حرکة صاعدة) لە دەنگی دۆ می پاشان دەگەڕێتەوە سەر دەنگە جێگیربووەکە (نغمة الاستقرار) .

١٣) لەڕووی (مەقامەوە)زۆربەی ئەم گۆرانیانە لە سەر مەقامی گەورەن (major)، کەم نەبێت لەسەر مەقام یان ( scale) بچوك ( minor) بن وە چارەکە (تۆن) بوونیان نیە ,مەگەر گەورەکان دانەری بن وەک لاواندنەوەی (لای لایە).

١٤)  زۆربەی ئەم گۆرانییانە بەشێوەی جیاواز جیاواز دەگوترێن، بەڵام هێندەی ئەوەی کە بە منالی وتراوە بە پێی شارەزایی خۆم لەم بوارەدا و گەڕانەوەم بۆ کاتی منالی سوودم لەم ئاوازانە وەرگرتووە لەکاتی نوسینەوەی نۆتەکاندا. یان بە پێ ی خەیالی خۆم دەستکاریم لە ئاوازەکاندا کردوە بۆ گونجاندنی لە گەڵ ڕیتمەکاندا .تەنانەت هەندێ ووشەی نەشیاوم لابردوە .

١٥)  گەر سەیری ئەم خاڵانەیسەرەوە بکەین کە باسم کردوە هەمووی لە (٣)سێ  پایەی گرنگی گۆرانی منالاندا کۆدەبنەوە ئەویش ئەمانەن (دەقی هۆنراوە –ئاواز–ڕیتم ) کە هەمویان ئامادەباشیان هەیە  لەم لێکۆڵینەوەو شیکاریەدا .

١٦)  ئەوەی ماوە کە بیڵێم ئەم گۆرانیانە زادەی ئەو ساتانەی منالیمە کە لە کۆڵانە تەسک و تەنگەبەرەکانی هەڵەبجەدا بیستومە و لەگەڵ منالاندا ئەو گۆرانی و یاریانەم کردوە .وە پێ ی نزیکی کلتوری ناو شاری هەڵەبجە  کە ئەویش کلتووری شارە کە جیاوازی هەیە لەگەڵ کلتووری گوند و لادێ  یەک دوو ئاواز نە بیت کە هی ناوچەی شارەزوورە .زۆربەی ئەم گۆرانیانە هاوبەشن لەگەڵ شاری سلیمانی و تەنانەت کەرکویش وەک گۆرانی (ئایشێ بنەوشێ) کە مامۆستا چالاک ئاماژەی پی کردوە لە پێشەکیەکەیدا.